

# تفسير القرآن العظيم

مسندا عن

الرسول صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين


للإمام الحافظ الناقد المفسر

أبي محمد عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي

رحمه الله تعالى

المتوفى سنة ٣٢٧ هـ


تەفسیری ئایەتەکانی :

## سورة الأنعام


وەرگێرانی : عليكم بالسنة

# سورة الأنعام



الله تعالى فەرموویەتی : (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١] .

**١** - ابن عباس وتی : عمر رضي الله عنه فەرمووی : ئەوە زانیمان دەربارەی سبحان الله، وە هیچ خودایەك نییە غەیری الله بەحەق کە شایەنی پەرستن بێ، ئەی چی دەربارەی (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ)، علي رضي الله عنه فەرمووی : وشەیەکی ڕازی بوونی الله یە بۆخۆی .

**٢** - ابن عباس وتی : وشەی سوپاسگوزاریە، وە کاتێ بەندە دەڵێت : الحمد لله، الله دەفەرموێت : بەندەم شوکرانەی من کرد .

**٣** - ابن عباس وتی : ئەوە سوپاسگوزاریە بۆ الله، خۆبەکەم زانینە بۆ الله، وە ئیقرار کردنە بە نیعمەتی الله وە دەستپێکردنی، وە جگە لەمەش .

**٤** - کعب وتی : ئەمە ستایشی الله یە .

(ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١] .

٥ - لە المعلى بن إسماعیل ەوە، کە پیاوێ هاتۆتە لای أبي بن کعب دەربارەی قەدەر پرسیاری لێکرد .

وتی : پاك و بێگەردی بۆ الله تعالی، بەڕاستی الله ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە، وە خێر و شەڕی درووست کردووە، هەرکەسی بێت بە خێرەکە بەختەوەر و دڵخۆشی دەکات، وە هەرکەسی بوێت بە خراپ و شەڕەکە بەدبەختی دەکات .

٦ - قتادة وتی : الله ئاسمانەکانی پێش زەوی درووست کردووە .

٧ - وهب بن منبه دەڵێت : عزیر وتی : ئەی پەروەردگار فەرمانت بە ئاو کرد، بەستی لەناوەڕاستی هەوادا، لەناویاندا کردوونت بە حەوت، وە ناوت لێناون ئاسمانەکان، پاشان فەرمانت بە ئاو کرد کە لەخۆڵەوە بێنە دەرەوە، وە فەرمانت کرد بە خۆڵ کە جیاوازبێ لەگەڵ ئاو، ئەوەش ئاوابوو، هەموو ئەمانە ناوت لێنان : زەویەکان، وە هەموو ئاوەکانیش [الله عزوجل ناوی لێناون] : ڕووبارەکان .

---

**ابن کثیر لە (البدایة - ٢/٤٦) دەڵێت : ناسراوە کەوا عزیر یەکێك بووە لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل**

٨ - مجاهد دەربارەی ئەو ئایەتە : (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١] .

وتی : ئەو ئایەتە دابەزی دەربارەی زەندیقەکان، وتیان : الله تاریکایی و قالۆچەکان و دووپشکەکان، وە نە هیچ شتێکی ناشرینی درووست نەکردووە، وە الله ڕووناکی درووست کردووە وە لەگەڵ هەموو شتێکی جوان .

وتی : ئەو ئایەتە دەربارەی ئەوان دابەزی .

٩ - السدي لەم ئایەتەدا : (وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ) .

وتی : الظلمات : تاریکایی شەوە .

١٠ - قتادة لەهەمان ئایەت دەڵێت : الله تاریکایی پێش ڕووناکی درووست کردووە .

(هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ) [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢]

١١ - ابن عباس دەربارەی (قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ) دەڵێت : ئەوە خەوتنە، کە ڕۆح تێیدا دەمرێت، پاشان بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە کاتێ هەڵدەستێتەوە .

**١٢** - ابن عباس دەربارەی (وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ) دەڵێت : ئەوە ئەجەلی مردنی ئینسانە .

**١٣** - قتادة دەربارەی (قَضَىٰٓ أَجَلٗاۖ وَأَجَلٞ مُّسَمًّى عِندَهُۥ) دەڵێت : ماوەی ژیانت تاوەکو ڕۆژی مردنت، وە ماوەی ڕۆژی مردنت تاوەکو ڕۆژی زیندووبوونەوەت، وە تۆ لە نێوان دوو ماوەدایت لە الله ـەوە [واتە لە نێوان دوو ئەجەل دایت] .

**١٤** - السري دەربارەی (ثُمَّ أَنتُمۡ تَمۡتَرُونَ) دەڵێت : گومانیان دەکرد [یانی تمترون بەمانای گومانکردن دێت] .

**١٥** - قتادة لەم ئایەتەدا : (لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ)، [سُورَةُ الأنعَامِ: ٨]

دەڵێت : ئەگەر فریشتەمان دابەزاندبا، وە دواتریش باوەڕیان نەهێنابا، ئەوا سزای زۆر پەلە و خێرا بۆیان دەهات .

**١٦** - السري بەهەمان شێوە ڕیوایەتی کردووە .

**١٧** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا)، [سُورَةُ الأنعَامِ: ٩]

دەڵێت : ئەگەر فریشتەیان بۆ هاتبا ئەوا بۆیان نەدەهات ئیللا لەسەر شێوەی پیاوێکی ئەوان دەبوو، چونکە ئەوان ناتوانن فریشتە ببینن .

**١٨** - محمد بن كعب لەم ئایەتەدا : (**وَمَنۢ بَلَغَۚ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٩]

وتی : هەرکەسێ قورئان بگەیەنێت وەك ئەوەیە پێغەمبەری ﷺ بینیبێ، پاشان خوێندیەوە : (**وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ**) .

وە لە حەدیسی أبي خالد ئەوە زیادەیە هەیە : وەك ئەوەی پێغەمبەری ﷺ بینیبێ و قسەی لەگەڵدا کردبێ .

**١٩** - قتادة دەربارەی ئەمە : (**لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٩]

وتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : دەربارەی الله بگەیەنن، هەرکەسێ ئایەتێ لە کتابی الله تعالی بگەیەنێت، ئەوا فەرمانی الله تعالی گەیاندووە .

**٢٠** - الربيع دەربارەی ئەمە : (**وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٩]

وتی : حەقە لەسەر ئەوکەسەی شوێنی رسول الله ﷺ دەکەوێت، بەو شێوەیە بانگەوازیان بکات وەك ئەوەی رسول الله ﷺ کردوویەتی، وە ئاگاداریان بکاتەوە وەك ئەوەی ئەو ئاگاداریان کردووتەوە، رسول الله ﷺ جەنگی لەگەڵی هیچ کەسێ نەکردووە لە خەڵکی هەتاوەکو بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام، ئەگەر ڕەتیان کردبێتەوە و قبووڵیان نەکردبێت، ئەوە بەبێ جیاوازی هەموویانی ئاگادارکردووتەوە .

**٢١** - قتادة لەم ئایەتەدا : (**كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُۘ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢٠]

دەڵێت : دەیانزانی کە ئیسلام دینی الله یە، وە محمد ﷺ نێردراوی الله یە، ئەوە نوسرابوو بۆیان لە تەورات و ئینجیل .

**٢٢** - عكرمة دەڵێت : النضر کە لەبەنی عبد الدار بوو وتی : کاتێ ڕۆژی قیامەت هات ئەوا لات و عوزا شەفاعەتم بۆ دەکەن، الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند : (**وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢١]

**٢٣** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (**ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢٣]

دەڵێت : واتە : دووڕووە موشریکەکان، الله ناوی لێناون دووڕوو چونکە شیرکیان شاردۆتەوە وە ئیمانیان دەرخستووە، لەکاتێ لەناو ئاگرن دەڵێن : ئامادەبن لێرە درۆ بکەن، بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێت، هەروەکو چۆن لە دونیادا سوودی پێگەیاندین، ئێمە لەدونیادا درۆمان کرد و سوودی پێگەیاندین لە حەقمان وە لە خوێنمان وە لە ماڵ و سامانمان، ئینجا دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان والله ئێمە موشریك نەبووین .

٢٣ - مجاهد لە هەمان ئایەت : (وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ)

دەڵێت : قسەی ئەهلی شیرکە، کاتێ دەبینن هەمووان دێنە دەرەوە [لە ئاگر] ئیللا ئەهلی شیرك نەبێ، وە دەبینن لە تاوانەکانیان خۆشبووە، بەڵام الله لە شیرکیان خۆشنابێت .

: خاڵێکی زۆرگرینگی موونافیق دیاری دەکات کە درۆ کردنە، تەنانەت لەئاگریش هەروازناهێنن و درۆ دەکەن، والله المستعان .

لە هەمان کات لێخۆشبوونی الله بۆتاوانەکانی ئەهلی شیرك، واتە هەرچی تاوانێك کە کردبێتیان غەیری شیرك لێیان خۆشدەبێت ئەگەرچی ئەهلی شیرکیش بن، بەڵام لە شیرکەکەیان خۆشنابێت .

٢٤ - قتادة لەم ئایەتەدا : (أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًاۚ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢٥]

دەڵێت : بە گوێیەکانیان دەبیستن، بەڵام هیچ شتێ تێناگەن، وەکو ئاژەڵ کاتێ بانگکردنێ دەبیستێ، بەڵام نازانێ کە چی پێ دەڵێن .

٢٥ - ابن عباس دەڵێ : هەموو شتێك لە قورئان : (وَلَوْ) [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٢٨] بوو، ئەوا هەرگیز ئەوشتە نابێت

**: واتە لەهەرشوێنێکی قورئان (ولو) هەبوو، ئەوا بزانە ئەوشتە نابێ هەرگیز، لەم ئایەتە ئەفەرموێ ئەگەربگەڕێنرابانەوە بۆدونیا ئەوا دەگەڕانەوە سەرهەمان کوفر، خۆی هەرگیزناتوانرێ بگەڕێنەوە بۆدونیا، مەبەستەکەی ئاوایە، والله اعلم.**

(**حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ**: ٣١] .

**٢٦** - عكرمة دەڵێت : ڕۆژی قیامەت نایەت تاوەکو بانگدەرێك بانگ دەکات : ڕۆژی قیامەت هات، ڕۆژی قیامەت هات، ڕۆژی قیامەت هات، سێ جار .

**٢٧** - رسول الله ﷺ لەم ئایەتەدا : (**يَٰحَسۡرَتَنَا**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ**: ٣١] .

فەرموویەتی : (الحسرة : ئەوەیە کە ئەهلی ئاگر شوێنەکانیان دەبینن لەبەهەشت کە بۆیان دانرابوو لەبەهەشت، فەرمووی : ئا ئەوە حەسرەتە) .

**٢٨** - ابن عباس لەم وتەیە : (یا حسرة)، دەڵێت : پەشیمانبوونەوەیە .

**٢٩** - السدي لەم ئایەتە : (**عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ**: ٣١] .

ئەمما (**فَرَّطۡنَا**) واتە : ئەوەی لەدەستیان چووە لە کردەوەی بەهەشت .

**٣٠** - مجاهد لەمەدا (یا حسرة) وتی : ئەو حەسرەتەیان بەسەریانەوە بووە کە گاڵتەیان بە نێردراوەکان دەکرد .

**٣١** - مرزوق وتی : کافر یان خراپەکار ڕوویان وەردەگێڕن ئەوکاتەی لەگۆڕ دەهێنرێنە دەرەوە، وەکو ناشرینترین شێوە دەبینرێن، وە ناخۆشترین بۆن، دەڵێت : تۆ کێی؟

ئەویش دەڵێت : مەگەر نامناسی؟

دەڵێت : نەخێر، الله شێوەی زۆر ناشرین کردووی، وە بۆنی زۆر ناخۆش کردووی .

دەڵێت : من کردەوە خراپەکانتم، ئەوە ئەو کردەوە پیسانە و بۆن پیسەیە کە لەدونیا هەتبوو .

وتی : بەدرێژایی سەرمکەوتی لەدونیادا، دەی ئامادەبە سەرکەوە، ئەوە ئەو فەرمایشتەیە : (**وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ**) [سُورَةُ **الأَنعَام**: ٣١] .

**٣٢** - السدي لەم ئایەتەدا (**يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْۚ**)

وتی : هیچ پیاوێکی زاڵم نامرێت، کە دەخرێتە گۆڕەوە ئیللا پیاوێکی ڕووخسار ناشرین دێتە لای، ڕەنگی ڕەشە، وە بۆنی پیسە، وە جلێکی پیسی لەبەرە تاوەکو لەگەڵی دەخرێتە گۆڕەوە **[واتە لەگەڵ پیاوە زاڵمەکە]**، کاتێ دەیبینێ پێی دەڵێت : ڕووخسارت چەندە ناشرینە .

ئەویش دەڵێت : ئەوە کردەوە ناشرینەکانتە .

دەڵێت : بۆنت چەندە ناخۆش و پیسە .

ئەویش دەڵێت : ئەوە بۆنی کردەوەکانتە وا ناخۆش و پیسە .

دەڵێت : جلەکانت چەندە پیسن .

وتی : ئەویش دەڵێت : ئەوە کردەوەکانتە وا پیسن .

پێی دەڵێت : تۆ کێیت؟

دەڵێت : من کردەوەکانتم .

وتی : ئەویش لەگەڵیدا دەبێت لەگۆڕەکەی، جا کاتێ لە ڕۆژی قیامەت زیندوو کرایەوە، پێی دەڵێت : تۆم هەڵگرت لە دونیادا بە چێژ و شەهەوات، ئەمرۆ تۆ من هەڵدەگری .

وتی : بەسەرپشتی سەردەکەوێ، لێی دەخوڕێت تا دەخرێتە ناو ئاگر، ئەمە ئەو فەرمایشتەیە : (يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ) .

**٣٣** - عقبة بن عامر رضي الله عنه، وتی : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو ئەگەر بینیت کەوا الله بە بەندەیەك دەبەخشێت، وە ئەویش . بەندەکە . بەردەوامە لەسەر تاوانەکانی، ئەوا ئەوە ئیستدراجە، پاشان ئەم ئایەتەی الله خوێندەوە : (فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٤٤] .

: استدراج : و اته الله بەره بەره شتانێك دەبەخشێت به بەكەسانی تاوانبارو كافر له ماڵ و سامان و منداڵ بۆ ماوەیەكی درێژ، وه هەرئەوەش دەكاته هۆی لەناوبردنیان .

(وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٤٥] .

**٣٤** - ابن عباس وتی : پاشان جبريل عليه السلام فەرمووی : ئەی محمد بڵێ : (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)، [سُورَةُ الفَاتِحَةِ: ٢] .

فەرمووی : ئەی محمد بڵێ، هەموو درووستكراوەكان هی الله ن، وه هەموو ئاسمانەكان و ئەوەی تێیدایه، وه هەموو زەویەكان ئەوەی تێیدایه و له نێوانیان دایه، لەوەی دەیزانیت و لەوەی نایزانیت .

**٣٥** - أبي العاليہ لەم ئایەته : (رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٤٥] .

وتی : ئینسانەكان جیهانێكن، وه جننەكان جیهانێكن، وه جگه لەوانەش هەژده هەزار جیهانی تر هەن، یان چوارده هەزار جیهان له فریشتەكان لەسەر زەوی، وه زەوی چوار زاویەیه لەهەریەك له زاویەكان سیانزه هەزار جیهانه وه پێنج سەد جیهانه، كه الله تعالی درووستیانی كردووه بۆ پەرستنی خۆی .

**٣٦** - تبيع لەو قەولەی الله تعالی : (رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ) .

وتی : جیهانەکان هەزار ئوممەتن، شەش سەد هەزار لەناو بەحرن، وە چوار سەدیان لەسەر وشکانین (سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ) .

**٣٧** - ماهان وتی : کۆمەڵێك هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان : ئەی رسول الله ئێمە تووشی تاوانی گەورە بووین .

پێغەمبەریش ﷺ هیچ وەڵامێکی نەدانەوە، کاتێ کە ڕۆشتن، ئەم ئایەتە دابەزی : (وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ ....)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٥٤] ، جا بانگیانی کرد و بۆیانی خوێندەوە .

**٣٨** - عکرمە لەم ئایەتەدا : (وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٦٠] .

وتی : لەکاتی نوستندا نەفسەکان [ئینسانەکان] دەمرن، هیچ شەوێك نییە ئیللا الله عزَّوَجَل ڕۆحی هەموویان دەمرێنێت، ئینجا پرسیار لەهەموو نەفسەکان دەکرێ سەبارەت بەوەی خاوەنەکەی کردوویەتی لە ڕۆژدا، پاشان بانگی فریشتەی گیانکێشان دەکرێ، [الله عز وجل بە فریشتەکە دەفەرموێت : ئەوە بمرێنە، ئەوە بمرێنە .

وە هیچ ڕۆژێك نییە ئیللا فریشتەی گیانکێشان سەیری کتابی ژیانی خەڵك دەکات .

قسەکار دەفەرموێت : سێ، وە دەفەرموێت دەڵێت : پێنج .

**: قائل يقول : مەبەستی الله تعالی یە، کە فەرمان بە ملك الموت دەکات سێ جاريان پێنج جارسەیری کتابی ژیانی خەڵك کات، والله اعلم .**

**٣٩** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ)، [سُورَةُ **الأَنعَامِ: ٦١]**

وتی : یارمەتیدەرانی فریشتەی گیانکێشانن .

---

**: لەم تەفسیرە دوو خاڵ وەردەگیرێ :**

**١ - ملك الموت بەتەنیا گیانی ئینسانەکان ناکێشێ، بەڵکو یارمەتیدەری هەیە کە الله خۆی دەزانێت چەندن .**

**٢ - ئەمە قورسی گیانکێشان دەردەخات .**

**والله اعلم .**

**٤٠** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ .

دەڵێت : ئەگەر پیاوێ ڕێگای حەق ونکردایە داوای لە الله دەکرد : ﴿لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٦٣] .

**٤١** - أبي العفيف، کە هاوەڵی معاذ بن جبل بووە، وتی : ئەهلی بەهەشت دەخرێنە ناو بەهەشتەوە بەپێی ئەم چوار بەشەوە : تەقواداران، پاشان سوپاسگوزاران، پاشان ئەوانەی لە الله دەترسن، پاشان هاوەڵانی دەستە ڕاست.

وتی : بۆچی ناویان لێنراوە سوپاسگوزاران؟

وتی : سوپاسی الله یان کردووە لەکاتی خۆشیدا، وە نەفسیان گەڕاندووتەوە بۆ ئارامی لەکاتی بەڵادا، ئەوانە لەسەر شوێنەواری تەقوادارانن.

**٤٢** - الحسن لەم ئایەتەدا : ﴿قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا﴾، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٦٥] .

وتی : سزاکان بۆیان ڕاگیراوە تاوەکو تاوانەکە دەکەن، کە تاوانەکەیان کرد سزا بۆیان دەنێردرێ .

(أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٦٥] .

**٤٣** - ابن عباس دەڵێت : الشيع : هەواو ئارەزووە جیاوازەکانن .

**٤٤** - مجاهد وتی : هەرشتێ فیتنە و جیاوازی تێدابێت .

**٤٥** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : ﴿وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٦٨] .

وە هاوشێوەی ئەمە لەقورئان، وتی : الله تعالى فەرمانی کردووە بە کۆك بوون ئیمانداران [و اتە متفق بوونیان لە بابەتەکان]، وە نەهی کردووە لە جیاوازی و بوون بە گرووپ، وە هەواڵی پێداون کە : ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی مشتومڕی و مناقشەکردن بووە لە دیندا .

﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ﴾، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٧٣] .

**٤٦** - الحسن وتی : (الشهادة) : ئەوەی کە درووستکراوەکان دەیبینن .

وە (الغیب) : ئەوەی لە ئێوە شاراوەیە و نایبینن .

﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ﴾، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٧٤] .

بە چەند شێوازێك تەفسیری بۆ کراوە :

## یەکەم :

**٤٧** - ابن عباس وتی : مانای (آزر) : بتە، وە باوکی إبراهیم علیه السلام ناوی (یازر) بووە، وە دایکی ناوی (مثاني) بووە، وە خێزانی ناوی (سارة) بووە .

وە دایکی إسماعیل ناوی (هاجر) بووە، کە لە هەمان کات خزمەتکاری پێغەمبەر إبراهیم بوو علیه السلام .

٤٨ - السدي لەهەمان ئایەت : ناوی باوکی آزر ە، بەڵام دەڵێت : بەڵکو ناوی (تارح)، وە (آزر) ناوی بتە، وتی : (أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا) .

## دووەم :

٤٩ - ابن عباس وتی : باوکی إبراهیم علیه السلام ناوی (آزر) نەبووە، بەڵکو ناوی (تارح) بووە .

٥٠ - مجاهد وتی : (آزر) باوکی إبراهیم علیه السلام نەبووە .

(وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٧٥] .

بە چەند شێوازێك تەفسیرکراوە :

## یەکەم :

٥١ - ابن عباس وتی : نێوانی زەوی و ئاسمان پێی نیشاندرا هەتا سەیری ئەوانی دەکرد لەسەر بەردێکەوە، وە بەردەکەش لەسەر نەهەنگەکە بوو، وە ئەو نەهەنگە کە خەڵك خواردنی لێ وەردەگرێت هەتاوەکو الله بڕیار لەنێوانیان دەدات .

٥٢ - ابن عباس لە هەمان ئایەت وتی : واتە : خۆر و مانگ و ئەستێرە [واتە کە موڵکی زەوی و ئاسمانی پێ نیشاندراوە ئەوا خۆر و مانگ و ئەستێرە بوو، والله اعلم] .

٥٣ - مجاهد یش بەهەمان شێوەی ڕیوایەت کردووە .

دووەم :

٥٤ - هەروەها ابن عباس دەڵێت : واتە موڵکی زەوی و ئاسمانەکان، وە درووستکراوی زەوی و ئاسمانەکان .

سێیەم :

٥٥ - عکرمة وتی : ئەوە فریشتەیە [واتە وشەی . ملکوتا . هەر بەمانای فریشتەیە]، بەڵام بەزمانی النبطية پێی دەڵێن : ملكوتا .

---

زمانی النبطية : زمانێکی کۆنی سامییە کە لە هەندێك ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن بەکاردێت، لەوانە ئەو ناوچانەی کە دەکەونە سوریا و لوبنان و ئوردنی ئێستا .

ئەم زمانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەکارهاتووە و بە نووسینی ناوازەی تایبەتمەند بووە کە بە (النسخ النبطي) ناسراوە و زۆرجار نووسینەکانی پەیوەست بوون بە بابەتە ئاینییەکانەوە .

**هەرچەندە زمانی النبطية وەك زمانە سامييەكانی دیكەی وەك عەرەبی و عیبری ئاشنا نییە، بەڵام بەهای مێژوویی هەیە، وە زمانی النبطية لە بنچینەدا بۆ دەق و ئەدەبیاتی ئایینی مەسیحیدا بەكارهاتووە .**

**٥٥** - مجاهد لەهەمان ئایەت وتی : حەوت ئاسمان تاوەكو عەرش بۆ إبراهيم عليه السلام دەركەوتن سەیری كردن، وە حەوت زەوی بۆی دەركەوتن و سەیری دەكردن **[و اتە ئەوەندە شتی پێ نیشیاندراوە، تەنانەت حەوت چینی زەوی و ئاسمانیش، والله أعلم]** .

**٥٦** - السدي وتی : لەسەر بەردێك دانرا، وە دەرگاكانی ئاسمانی بۆ كرایەوە، سەیری موڵكی الله تعالى دەكرد لەوێدا، تەنانەت سەیری شوێنی خۆی كرد لە بەهەشت .

وە دەرگای زەویەكانی بۆ كرایەوە هەتاوەكو سەیری خوارەوەی زەوی كرد، ئەوە ئەو فەرمایشتەیە كە دەفەرموێت : (**وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَاۖ**)، [سُورَةُ العَنكَبُوتِ: ٢٧] .

## چوارەم :

**٥٧** - أبي صالح وتی : حەقە **[و اتە حەقی پێ نیشاندراوە، والله أعلم]** .

(فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٧٦] .

**٥٨** - السدي وتی : ئەوە [هەسارەی] موشتەریە .

---

: جا لە حاشیەکە ڕیوایەتێکی تر هاتووە هەر لە السدي کە دەڵێت : (رأى کوکبا) ئەوە موشتەریە، وە لەکاتی مەغریبدا ڕووەو قیبلە دەردەکەوێت .

**٥٩** - زيد بن أسلم لەم ئایەتەدا : (نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٨٣] .

دەڵێت : ئەوە عیلمە، کە الله تعالى ویستی لەهەرکەسێ بێ بەهۆی عیلمەوە بەرزی دەکاتەوە لە دونیادا .

(وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٨٤] .

**٦٠** - حرب بن الأسود وتی : الحجاج ناردی بەدوای يحيى بن يعمَر، وتی : پێم گەیشتووە کەوا تۆ پێت وایە کە الحسن و الحسين لە نەوەی رسول الله ﷺ ن و لە کتێبی الله تعالى دا هاتووە؟

وە منیش لە سەرەتاکەی تاوەکو کۆتاییەکەی سەیرم کرد و نەمدۆزیەوە .

[يحيى بن يعمَر] وتی : ئایە مەگەر سورەتی الأنعام نەتخوێندووتەوە : (وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ) تا گەیشتە (وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٨٥]؟

ئەویش وتی : بەڵێ .

وتی : ئایە مەگەر لە نەوەی إبراهیم نیە و باوکی نییە؟

وتی : ڕاستەکەی .

٦١ - قتادة لەم ئایەتەدا : (أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٠] .

وتی : اللّٰه تعالی باسی هەژدە پێغەمبەری کردووە، پاشان فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرتان [واته رسول الله ﷺ] کە ئیقتدا بکات پێیان، وتی : ئێوەش ئیقتدا بکەن بە چاکەکارانی پێش خۆتان .

٦٢ - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٠] .

فەرمووی : ئەی محمد پێیان بڵێ : کە ئێمە داوای هیچ پاداشتێکتان لێناکەین لەوەی کە بانگەوازیتان دەکەین .

(وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩١] .

**٦٣** - ابن عباس وتی : ئەوانە كافرەكانن كە باوەڕیان بەهێز و قودرەتی الله تعالى نییە، هەركەسێ باوەڕی بە الله بێ كە بەسەر هەموو شتێكدا توانا و قودرەتی هەیە، ئەوا الله یان بەگەورە زانیوە بەقەد ئەوەی كە شایەنی بەگەورە زانینە، وە هەركەسێ باوەڕی بەمە نەبێت، ئەوا باوەڕی نیە بە الله تعالى بەقەد ئەوەی شایەنی بەگەورە زانینە .

**٦٤** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ)، واتە لە بەنی ئیسرائیل، یەهودیەكان وتیان : الله كتێبی بەسەرتدا دابەزاندووە؟

[رسول الله ﷺ] فەرمووی : بەڵێ .

وتیان : والله كتێبێكیشت لەئاسمانەوە بۆ دانەبەزیوە،

الله تعالى ئەوەی دابەزاند : (قُلۡ) ئەی محمد بڵێ (مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ تَجۡعَلُونَهُۥ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩١] .

(وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩١] .

**٦٥** - قتادة وتی : ئەوانە جولەکەو گاورن، کە قەومێ بوون الله عیلمی پێیاندابوو، بەڵام ئیقتدایان پێنەکرد، وە وەریان نەگرت، وە کردەوەشیان پێنەکرد، الله تعالی لەمەدا زەمی کردەوەیان دەکات .

(وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٢] .

**٦٦** - ابن عباس وتی : مەبەست لە (أم القرى) واتە : مەککە .

**٦٧** - السدي وتی : (أُمَّ ٱلْقُرَىٰ)، ئەوە مەککەیە، وە ناوی لێنراوە : (أم القرى)، چونکە یەکەم ماڵ بوو کە لەوێ دانرا .

وە بەهەمان شێوە لە مجاهد و الضحاك و الحسن و قتادة و يحيى بن يعمر و أبي فاختة ڕیوایەت کراوە .

(وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٢] .

**٦٨** - مسروق وتی : کاتی نوێژەکانیان دەپارێزن [واتە نوێژەکان لەکاتی خۆی دەکەن] .

**٦٩** - قتادة وتی : دەستنوێژ و کاتی نوێژەکانیان، وە ڕکوع و سوجدەکانیان دەپارێزن **[واتە کە دەستنوێژیان گرت بەشێوەیەکی جوان دەستنوێژ دەگرن، بەوشێوەیەی کە هاتووە، وە لەکاتی خۆی نوێژەکان دەکەن، وە ڕکوع و سوجدە بردنیان بەوشێوەیە کە هاتووە، والله اعلم]** .

**٧٠** - أبا خلف الأعمى وتی : ابن أبي سرح وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنوسی، ئەهلی مەککە هاتنە لای، وتیان : ئەی ابن أبي سرح چۆن قورئان بۆ ابن أبي کبشة دەنوسیتەوە؟

وتی : دەتوانم چۆن ویستم ئاوا بینوسم، الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند : **(وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا)**، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٣] .

---

: ابن أبي کبشة مەبەستیان پێغەمبەر محمد ﷺ .

قورەیش نەسەبی پێغەمبەر ﷺ دەگەڕاندەوە بۆ أبي کبشة، کە (وهب بن عبد مناف بن زهرة) باوکی (آمنة) دایکی پێغەمبەرﷺ کونیەی (أبا کبشة) بوو، والله أعلم.

**٧١** - السدي لەم ئایەتەدا : **(وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ)** [سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٣] .

وتی : ئەم ئایەتە دەربارەی عبد الله بن سعد بن أبي سرح القرشي دابەزی، کە مسوڵمان ببوو، وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنوسیەوە، کاتێ بەسەریدا

دەخوێنرایەوە [کە بنوسێت] : (سميعا عليما)، ئەو دەینوسی : (عليما حكيما)، وە گەر وتبای بنوسە : (عليما حكيما)، ئەو دەینوسی : (سميعا عليما)، ئیتر گومانیان لێکرد و ئەویش کوفری کرد، وە [عبد الله بن سعد] وتی : گەر محمد وەحی بۆی هاتبێت، ئەوا وەحی بۆ منیش هاتووە .

---

**: عبد الله بن سعد برای شیری ئیمامی عثمان بن عفان بووە رضي الله عنه، ئەو کارەی کە کردوویەتی لە دوای مسوڵمانیەتی بوو کە مرتد بوویەوە، ئیتر دووبارە گەڕایەوە بۆ مەککە، بەڵام لە کاتی فەتحی مەککە خۆی لەماڵی ئیمامی عثمان رضي الله عنه دەشارێتەوە لە ترسان، پاشانیش بەیعەت وەردەگرێ و تەوبە دەکات، ئیتر لەوکاتیەوە مرتد نەبۆتەوە، بگرە لە چەندین شەڕیش بەژدار بووە و بۆتە قائد و مجاهد، والله اعلم .**

**٧٢** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ) وتی : ئەوە لەکاتی مردنە، وە (البسط) : لێدانە (يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ)، [سُورَةُ مُحَمَّدٍ: ٢٧] .

**٧٣** - أبي صالح لە ئایەتەدا : (بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ)، وتی : بە سزا [واتە بەسزا ڕۆحیان دەکێشرێت لەکاتێ مردن] .

**٧٤** - ابن عباس وتی : دوو ئایەت هەن کە ئاماژە بە کافران دەکەن لە کاتی مردنیان : (**وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ**) تاوەکو : (**بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٣**] .

وتی : ئەوە دوو ئایەتەن کە ئاماژە بە کافرەکان دەدات لە دونیادا .

(**وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ٩٦**] .

**٧٥** - قتادة لەم ئایەتەدا وتی : هەموو باڵندە و ئاژەڵێك تێیدا پشوو دەدەن **[و اته لە شەودا]** .

**٧٦** - عبد العزيز بن أبي داود وتی : صهیب لەلای خێزانەکەی بوو، جا **[صهیب]** بۆ ماوەیەکی درێژ لە شەودا دەمایەوە، جا **[خێزانەکەی]** پێی وت : ئەی صهیب تۆ خراپ لەگەڵ خۆتدا دەکەی .

صهیب وتی : الله شەوی گێڕاوە بۆ صهیب تا تێیدا پشوو بدات، بەڕاستی صهیب گەر باسی بەهەشت بکرێ تامەزرۆیی بۆی زیاتر دەبێ، وە گەر باسی ئاگریش بکرێ ئەوا خەوی دەفرێ و نامێنێت **[وەك مەجازی و ایوتوە نەك خەوەکە بفرێت، یانی وەك هەندێ کەس کە گەرخەوی نەمێنێ دەڵێت خەوم فرِی نەما]** .

**٧٧** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (**سُبۡحَٰنَهُۥ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٠**]، وتی : بەریکردنی خۆیەتی الله لە هەموو خراپەیەك، پاشان عمر بە علي رضي الله عنهما وت وە هاوەڵانیشی لەلا بوو : لا إله إلا الله ئێمە ئەومان دەناسی، ئەی سبحان الله چییە؟

وتی : علي رضي الله عنه وتی : وشەیەکە الله بۆخۆی خۆشدەوێت، وە پێی ڕازیە، وە خۆشەویستە لەلای کە بیلێیت .

**٧٨** - زيد بن أسلم لەم ئایەتەدا : (**قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡۖ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٤**] .

دەڵێت : الله تعالى فەرموویەتی : (البصائر) : هیدایەتە، بینینی ئەوەی لەدڵیان دایە بۆ دینەکەیان، ئەوە ئەو بینینەی چاوی سەر نییە، وە خوێندیەوە : (**فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ**)، [**سُورَةُ الحَجِّ: ٤٦**] .

وتی : بەڕاستی دین بینین وبیستنی هەیە لەو دڵەدا .

(**وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكُواْ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٧**]

**٧٩** - ابن عباس وتی : الله تبارك وتعالى دەفەرموێت : ئەگەر ویستبام هەموویانم کۆدەکردەوە لەسەر هیدایەت .

**٨٠** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٨] .

[کافرەکان] وتیان : ئەی محمد کۆتایی بێنە بە قسەوتن بە خواکانمان، یانیش ئێمە جنێو بە پەروەدگارت دەڵێین، الله تعالى ڕێگری لێکردن لەوەی قسە بە بتەکانیان بڵێن : (فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ) .

**٨١** - قتادة وتی : مسوڵمانەکان قسەیان بە بتەکانی کافرەکان دەوت، کافرەکانیش دوژمنانە جنێویان دەدا بە الله تعالى بەبێ عیلم، الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند : (وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٨] .

**٨٢** - السدي لەم ئایەتەدا : (وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٨] .

وتی : کاتێ أبا طالب نزیکی مردن بوویەوە، قریش وتی : وەرن با بچینە لای ئەو پیاوە، فەرمانی پێبکەین کە ڕێگری لەو کوڕە برایەی بکات بەرامبەر ئێمە، چونکە بەڕاستی ئێمە شەرم دەکەین دوای مردنی بیکوژین، عەرەب دەڵێت : ڕێگری دەکەن لەوەی کە مرد ئینجا بیکوژن .

ئیتر ئەوانەی کە چووبوون أبو سفیان و أبو جهل و النضر بن الحارث و أمية و أُبي ابنا خلف و عقبة بن أبي معيط و عمرو بن العاص، و الأسود بن البختري، وە پیاوێکی تریش لەگەڵیان نێردرابوو پێی دەوترا : المطلب .

وتیان : داوای چونە ژوورەوەیان کرد بۆ لای أبي طالب، هاتە لای أبا طالب، وتی : ئەوانە گەورانی قەومەکەت دەیانەوێت بێنە لات، ئەویش ڕێگەیدان بێن، کە چوونە لای .

وتیان : ئەی أبا طالب تۆ گەورەی و پێشەوامانی، وە محمد ئازارمان دەدات، وە ئازاری خواکانمان دەدات، پێمان خۆشە بانگی بکەیت کە وازبێنێت لەباسکردنی خواکانمان، ئێمەش واز لەخوای ئەو دێنین .

بانگی کرد، پێغەمبەر ﷺ هات، أبو طالب پێی وت : ئەوانە قەومی تۆن وە کوڕی مامتن .

رسول الله ﷺ فەرمووی : چیتان دەوێت؟

وتیان : دەمانەوێت واز لە خواکانمان بێنیت، ئێمەش واز لە تۆ و خوای تۆ دێنین .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئایە دەتانەوێت ئەوەتان پێ بدەم، ئایە ئێوە ئامادەن وشەیەکتان پێ بدەم کە گەر قسەی پێ بکەن، ئەوا دەسەڵاتی

عەرەب دەگرنە دەست، وە عەجەمیش بەمە پشتیوانیتان دەكات، وە جزیەتان پێ دەدەن؟

أبو جهل وتی : وأبيك [وەك سوێندێك بەكارهێناوە یاخود وەك پشتگیری و تەئكیدبوون]، پێتی دەدەین دەی وەك ئەوە، ئەو وشەیە چییە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بڵێن : لا إله إلا الله .

ئەوانیش پشتیان لێكرد و ڕەتیان كردەوە .

أبو طالب وتی : جگە لەو وشەیە بڵێ، چونكە قەومەكەت لەوە دەترسن

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی مامە من جگە لەو وشەیە وشەی تر ناڵێم تاكو خۆر دێنن، دەستتان بخەنە دەستم، ئەگەر خۆرم بۆ بێنن، دەست بخەنە دەستم جگە لەوە هیچی تر ناڵێم [مەبەستی پێغەمبەرﷺ ئینكاری كردن بووە لەوەی كە غەیری وشەی لا إله إلا الله وشەی تر ناڵێم، وە كە باسی خۆر هێنانی كردووە وەك مەجازیەك، وە بۆ مستحیل بوونی گۆڕانی ڕەئی پێغەمبەرﷺ كە وشەكەی بگۆڕێت، والله اعلم] .

دەیویست كە بێ ئومێدیان بكات ئیتر [كافرەكان] توڕەبوون، وە وتیان : بەسیكە لە قسە وتن بە خواكانمان گەرنا ئێمەش قسەت پێدەڵێین، وە قسە بەوەش دەڵێین كە فەرمانت پێدەكات، ئەوە ئەو فەرمایشتە بوو : (فیسبوا الله عدوًا بغیر علم) .

**٨٣** - أبي أمامة رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ دەفەرمویت : ئەی باوکی ذر پەنا بگرە بە الله لە شەیتانی جن و مرۆڤ .

فەرمووی : ئەی پێغەمبەری الله ﷺ ئایە مرۆڤیش شەیتانی هەیە؟

فەرمووی : بەڵێ، (**شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١١٢] .

**٨٤** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (**زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١١٢].

وتی : قسەکانی یەکتر جوان دەکەن، تاوەکو شوێن فیتنەکانیان بکەوی .

**٨٥** - وە ڕیوایەت کراوە لە مجاهد و عكرمة کە دەڵێن : شتی باطل بە زمانیان دەڕازێننەوە .

(**وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١١٤] .

**٨٦** - ربيعة وتی : الله تبارك وتعالى قورئانی دابەزاندووە وە شوێنێکی بەجێهێشتووە بۆ سوننەت، رسول الله ﷺ سوننەتی هێناوە، وە شوێنێکی بەجێهێشتووە بۆ ڕەئی **[بێگومان ڕەئی درووست نەك لە خۆتەوە بێت]** .

٨٧ - الربيع لەم ئایەتەدا : (وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓ)، وتی : الله تعالى ڕێكری كردووە لە تاوانی نهێنی و ئاشكرا كە ئەنجامی بدەیت .

٨٨ - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ)، وتی : (ظاهر الإثم) : زەواجكردنە لەگەڵ دایكان و كچەكانیان .

ابن عباس وتی : (باطنه) : زینایە .

سعيد بن جبير یش هەمان تەفسیری بۆ كردووە .

٨٩ - أبي زميل وتی : لای ابن عباس دانیشتبووم، وە المختار بن أبي عبيد مناقشەی كردووە، ئیتر پیاوێك هاتە لای ابن عباس، وتی : ئەی باوكی عباس أبو إسحاق پێی وایە كە ئەو شەو وەحی بۆ دێت .

ابن عباس وتی : ڕاستە، ئەویش بەمە نارەحەت بوو .

وتم : ئایە ابن عباس دەڵێت ڕاستە؟

ابن عباس وتی : دوو وەحی هەیە، وەحی الله و وەحی شەیتان، وەحی الله تعالى بۆ محمدە ﷺ، وە وەحی شەیتان بۆ دۆست و خۆشەویستانیەتی، پاشان ئەمەی خوێندەوە : (وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٢١] .

خەواریج درۆ دەكەن

**٩٠** - عیسی بن عبد الرحمن وتی : پرسیارم لە الشعبي كرد دەربارەی ئەم ئایەتە : (**وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٢١]، عیسی وتویەتی : ئەوە خەواریجەكان پێیان وایە دەربارەی دەسەڵاتدارە .

الشعبي وتی : درۆیان كرد، ئەو ئایەتە دابەزیوە دەربارەی موشریكان، كە هاوەڵانی رسول الله ﷺ مشتومڕیان دەكرد، دەیانوت : ئەمما ئەوەی الله نەیكوشتووە نایخۆین واتە هی مردوو، یانیش ئەوەی ئێوەبیكوژن ئەوا لێی دەخۆین، ئینجا الله تعالی ئەم ئایەتەی دابەزاند : (**وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ**)، تاوەكو (**إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ**)، وتی : ئەگەر گۆشتی مردوو بخۆن، وە گوێڕایەڵیان بكەن ئەوا لە موشریكانن **[خەواریج لەهەموو ڕوویەكەوە بەدرۆزن ناویان هێنراوە، وە پوچەڵ كراوەتەوە بیروڕایان]** .

(**أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ**)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٢٢] .

**٩١** - الضحاك وتی : **[ئەو ئایەت مەبەستی پێی]** عمر بن الخطاب ـه رضي الله عنه .

**٩٢** - زيد بن أسلم لە هەمان ئایەت وتی : رسول الله ﷺ دوعای دەكرد، دەیفەرموو : ئەی پەروەردگار ئیسلام بەعیززەت بكە بە أبي جهل بن هشام یان عمر بن الخطاب .

وتی : هەردووکیان لەناو گومڕایی مردبوون، الله تعالی ئیسلامی زیندوو کردەوە بە عمر رضي الله عنه وە بەعیززەتی کرد، وە أبا جهل یش لەناو گومڕایی و مردوویەکەی جێگیری کرد،

وتی : دەربارەی ئەوانە ئەو ئایەتە دابەزی .

(**فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ**)، [**سُورَةُ الأنعَامِ**: ١٢٥] .

**٩٣** - رسول الله ﷺ لەم ئایەتەدا فەرموویەتی : ئەگەر ئیمان چووە دڵێکەوە، ئەوا فراوان و هەستی دڵنیایی دووروست دەبێت .

وتیان : ئەی رسول الله ﷺ ئایە بۆ ئەمە هیچ نیشانەیەك هەیە؟

فەرمووی : بەڵێ، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی هەمیشەیی **[واتە بیر لە قیامەت و ماڵی هەمیشەیی دەکاتەوە]**، وە دووردەکەوێتەوە لە ماڵی بێهوودە **[مەبەستی لە دونیایە]**، وە خۆ ئامادەکردن بۆ مردن پێش ئەوەی بمرێت .

**٩٤** - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (**وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا**)، [**سُورَةُ الأنعَامِ**: ١٢٥] .

دەڵێت : الله بیەوێت گومڕایی بکات، لەسەری تەنگ و تەسك دەکات هەتاوەکو ئیسلام لەسەری تەنگ دەبێت، ئیسلامیش خۆی فراوانە، ئەوە ئەوەیە کە دەفەرموێت : (**وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ**)، [**سُورَةُ الحَجِّ**: ٧٨].

دەڵێت : هیچ تەسکی و تەنگیەکی لەسەرتان دانەناوە .

٩٥ - الأوزاعي لەم ئایەتەدا : (وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٢٥] .

دەڵێت : چۆن دەتوانرێت کەسێ کە الله سینگی تەنگ و تەسك کردبێتەوە و ببێتە مسوڵمان؟!

٩٦ - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٢٥] .

دەڵێت : هەروەکو چۆن بەنی ئادەم ناتوانێت بگاتە ئاسمان، بەهەمان شێوە ناتوانێت ئیمان و توحید بخاتە دڵیەوە هەتاوەکو الله تعالی دەیخاتە دڵیەوە .

(وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٤١] .

٩٧ - مجاهد وتی : ئەگەر بەقەد أبي قبیس زێڕت لە گوێڕایەڵی الله تعالی دا خەرج کردبێت، ئەوا ئیسرافت نەکردووە .

وە ئەگەر صاعێکت لە سەرپێچی الله تعالی دا خەرج کردبێت، ئەوا ئیسرافت کردووە .

**٩٨** - عون بن عبد الله وتی : ئەوەی کە ماڵی کەسی تر دەخوات .

**٩٩** - السدي لەمەدا (وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ)، وتی : ماڵەکانتان مەبەخشن و خۆشتان بە هەژاری بمێننەوە .

---

**: واتە بەو شێوازە مەبەخشە کە دواتر خۆت موحتاجی کەسی تر ببیتەوە، والله اعلم.**

**١٠٠** - أبي مجلز لەم ئایەتە : (وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ)، **[سُورَة الأَنعَامِ: ١٤٢].**

وتی : ئاگادارکردنەوەیە لە سەرپێچی .

**١٠١** - الوليد الهمداني وتی : پرسیارم لە قتادة کرد دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى، وتم ئایە ئەم ئایەتە : (وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ) لەگەڵ چیەتی؟

[قتادة] وتی : هەرچی سەرپێچیکردنی الله تعالى ئەوا لە هەنگاوەکانی شەیتانە .

**١٠٢** - ابن زيد لەم ئایەتەدا : (خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ)، وتی : شوێنکەوتەی گوێڕایەڵی شەیتان مەبن، ئەوە تاوانە بۆتان، گوێڕایەڵی کردنی شەیتان بۆ پیسەکانە **[واتە پیسەکان گوێڕایەڵی شەیتان دەکەن]** .

(قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٤٥] .

١٠٣ - ابن عباس وتی : جاهیلیەکان شتانێکیان دەخوارد، وە وازیان لە شتانێکی پیس هێنابوو، الله تعالى پێغەمبەری بۆ ناردن ﷺ، وە کتێبی بۆ دابەزاندن، حەڵاڵی حەڵاڵ کرد، وە حرامیشی حەرام کرد، ئەوەی حەڵاڵ بوو حەڵاڵی کرد، ئەوەی حەرامیش بوو حەرامی کرد، وە ئەوەشی کە لێی بێدەنگ بوو ئەوا لێی خۆشبوو، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : (قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا) .

١٠٤ - جابر بن زيد وتی : پرسیارم لە البحر کرد واتە ابن عباس : دەربارەی پیاوێك کە سەردەبڕێ و لەبیردەکات [بسم الله بکات] .

ئەویش ئەو ئایەتەی خوێندەوە : (قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا) .

---

: وەك گەورەیی و پڕزانستی بە ابن عباسی وتوە بەحروالله اعلم .

١٠٥ - مجاهد لەم ئایەتەدا : (فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٤٥] .

دەڵێت : نابێت ئەوکەسە ڕێگاگر بێت [واتە ئەوانەی ڕێگە لەخەڵکی دەگرن]، وە نە لە پێشەوای مسوڵمانان جیابوبێتەوە، وە نە لەژێر سەرپێچی الله

دەرچێت ئەوا ڕووخسەتی بۆ هەیە، وە هەرکەسێ زیادەڕۆیی تێدابکات، یان بگەڕێتەوە سەری، یان لەسەرپێچی الله دا بێت، ئەوا ڕووخسەتی بۆ نییە ئەگەر ناچاریش بێت .

١٠٦ - سعيد بن جبير لە هەمان ئایەت دەڵێت : ئەوەی ڕێگری لەخەڵك دەكات ڕووخسەتی بۆ نییە ئەگەر برسی بێت و گۆشتی مردوو بخوات، یان گەر تینوو بێ عارەق بخواتەوە .

١٠٧ - مقاتل بن حيان لەم ئایەتەدا : (غَفُورٌ رَّحِيمٌ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٤٥] .

دەڵێت : ئەوەی كە دەخورێت لەكاتی ناچاریدا، وە پێمان گەیشتووە والله أعلم : كە نابێ لە سێ تیكە زیاتر بێت .

١٠٨ - ابن طاوس لە باوكیەوە، كە پیاوێك بە ابن عباس ی وت : خەڵكی دەڵێن : شەڕ بەقەدەر نییە .

ابن عباس وتی : لە نێوان ئێمە و ئەهلی قەدەر ئەم ئایەتە هەیە : (سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ)، تاوەكو (فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ) [سُورَةُ الأَنعَامِ : ١٤٨ - ١٤٩] .

(أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥١] .

**١٠٩** - عبادة بن الصامت وتی : رسول الله ﷺ بە حەوت سیفات وەسیەتی بۆ کردووین : شیرك بۆ الله تعالى بڕیارنەدەین، ئەگەر سووتاندیانی، و پارچەکرایت، و هەڵواسرایت .

(وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥١] .

**١١٠** - ابن عباس لەم ئایەتەدا وتی : جاهیلیەکان لە نهێنیدا زینایان بە خراپە نەدەزانی، لە ئاشکرادا بە ناشرینیان دادەنا، الله تعالى زینای حەرام کردووە بە نهێنی و ئاشکرا .

## کێ بەیعەتم پێدەدات؟

**١١١** - عبادة بن الصامت وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : کێ بەیعەتم پێدەدات لەسەر ئەم سێ ئایەتانە؟

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : (قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٍ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ

(ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥١]، هەتاوەکو سێ ئایەتەکەی تەواوکرد .

پاشان فەرمووی : هەرکەسێ بەرامبەر بەم ئایەتانە بەوەفا بێت [واتە لەژێر بەیعەتەکە دەرنەچێ] ئەوا الله تعالى پاداشتی پێ دەدات، وە هەرکەسێ شتێ [لەم ئایەتانە] کەم بکاتەوە، ئەوا سزای الله تعالى ی پێدەگات لە دونیادا، وە هەرکەسێ دوایبخات بۆ قیامەت ئەوا فەرمانەکەی پەیوەستە بە الله تعالى، گەر ویستی لێبێت [سزاکەی] پێدەدات، وە گەر بیەوێت لێی خۆشدەبێت .

١١٢ - زيد بن أسلم لەم ئایەتەدا : (وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٢] .

وتی : (بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ) : ئەوەیە کە بیخوات لەگەڵیان گەر هەژار بوو، بەڵام گەر دەوڵەمەند بوو نابێ بیخوات [واتە ئەوکەسەی کە سەرپەرشتیاری منداڵە بێ باوکەکان دەکات هەژاربوو ئەوا دەتوانێت لەو برە خواردنەی کە بێ باوکەکان هەیانە لەگەڵیان بیخوات بەڵام زیادەڕۆیی و زوڵم نەکات، بەتایبەت گەر منداڵەکان باوکیان دەوڵەمەند بوو، بەڵام گەر سەرپەرشتیار خۆی دەوڵەمەند بوو وە توانای خواردنی ڕۆژانەی هەبوو ئەوا نابێ لەگەڵ منداڵە بێ باوکەکان بیخوات] .

الله تعالى فەرموویەتی : (وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ)، [سُورَةُ النِّسَاءِ: ٦] .

پرسیاری لێکرا دەربارەی جلوبەرگ .

[زيد بن أسلم] وتی : الله تعالی باسی جلی نەکردووە، بەڵکو باسی خواردنی کردووە .

(أَشُدَّهُۥ) مەبەست لێی چەند ساڵە؟

(حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٢] .

١١٣ - ابن عباس وتی : سی و سێ ساڵە .

مجاهد و قتادة بەهەمان شێوە ڕیوایەتیان کردووە .

١١٤ - الحسن وتی : چل ساڵە .

١١٥ - سعيد بن جبير وتی : هەژدە ساڵە .

١١٦ - السدي وتی : سی ساڵە .

١١٧ - عكرمة وتی : بیست و پێنج ساڵە .

١١٨ - محمد بن قيس وتی : پانزە ساڵە .

(ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٣] .

١١٩ - الضحاك لەم ئایەتەدا : (لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ) .

دەڵێت : بەڵکو لە ئاگر بترسن بە کردنی پێنج نوێژەکە .

---

: والله اعلم ئەمانە دەگرێتەوە :

١ - کە پێنج نوێژەکە ئەنجام دەدەیت یادی ئاگرو قیامەت بکەی .

٢ - گوتنی دوعاکەی رسول الله ﷺ لە دوای تەحیات کاتێ دەفەرموێت : (اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، ومن عذاب النار، ومن فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدَّجال)، رواه البخاري (١٣٧٧) .

(ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٤] .

١٢٠ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : تەورات لە شەشەم شەوی ڕەمەزان دابەزی .

١٢١ - زيد بن أسلم لەم ئایەتەدا : (وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٦] .

وتی : (الدراسة) خوێندنەوە و عیلمە .

وە خوێندیەوە : ئەوەی تێیدایە بیخوێننەوە و دیراسەی بکەن .

وتی : فێربن لەوەی تێیدایە، ئەمە بەنەزانی نەهاتووە [والله اعلم واتە بۆ ئەوە نەهاتووە تۆ نەیخوێنیەوە یان بێ ئاگاییانە بیخوێنیتەوە] .

وە خوێندیەوە : (وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٥] .

١٢٢ - السدي لەم ئایەتەدا : (وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ)، وتی : ئەگەر بێ ئاگابین لەخوێندنەوەی، ئەوا نازانین چییە .

١٢٣ - عبد الله لەم ئایەتەدا : (أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٨] .

وتی : خۆر و مانگ هەڵدێن، وەك دوو وشتری پێكەوە لە ڕۆژئاواوە .

١٢٤ - عمرو بن العاص لەم ئایەتەدا : (لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٨] .

وتی : [ئەوكاتەی] خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهات .

: واتە كە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهات هیچ تەوبەیەك وەرناگیرێ و سوودی پێناگەیەنێت چونكە قیامەت هەڵدەستێ، والله اعلم .

١٢٥ - ابن عباس لەم ئایەتەدا : (إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٩] .

دەڵێت : الله تعالى فەرمانی بە ئیمانداران كردووە بە جەماعەت [واتە هەموویان لەسەریەك ڕێباز بن و ناكۆك نەبن]، وە ڕێگری كردووە لە جیاوازی و

دووبەرەکی، وە پێی ڕاگەیاندووین کە : ئەوانەی پێش ئەوان بەهۆی مناقشە و مشتومڕیەوە دەربارەی دین لەناوچوون .

**١٢٦** - السدي لەم ئایەتەدا : (لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٥٩] .

دەڵێت : فەرمان بەکوشتنیان نەکرا، دواتر **[ئایەتەکە]** نەسخ بۆوە، ئیتر فەرمانکرا بە کوشتنیان لە سورەتی براءة **[واتە توبة]** .

**١٢٧** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لە ڕۆژی جومعەدا سێ کەس ئامادە دەبن : پیاوێك کە ئامادەبووە و قسەی بێ سوود دەکات کە ئەویش پشکێکی لێی هەیە .

وە پیاوێك کە بۆ دوعاکردن ئامادە بووە، کە ئەویش پیاوێکە و داوا لە الله تعالى دەکات، گەر الله ویستی لێبێت پێی دەبەخشێت، وە گەر ویستی لێبێت لێی قەدەغە دەکات .

وە پیاوێك کە ئامادەبووە بە گوێگری و بێدەنگیەوە **[واتە گوێی ڕاگرتووە بەژیری و بێدەنگی و هیچ قسە ناکات]**، وە سنووری کەسی مسوڵمان نابەزێنێت و ئازاری هیچ کەسێ نادات، ئا ئەوە کەفارەتی ئەو جومعەیەشە کە لەدوای دێت، وە سێ ڕۆژی دیکەشی بۆ زیاد دەکرێ، بەهەمان شێوە، بۆیە الله تعالى دەفەرموێت : (مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٠] .

١٢٨ - عقبة بن عامر رضي الله عنه وتی : هاوەڵانم پێم گەیشتن : وتیان : پێغەمبەر ﷺ لەم ئایەتەدا : (وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٠] .

فەرموویەتی : ئەوە [وتنی] وشەی شیرکە .

١٢٩ - ابن عباس وتی : شیرکە .

١٣٠ - بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە عبد الله بن مسعود و أنس بن مالك و أبي وائل، و عطاء و الحسن و سعيد بن جبير و عكرمة و النخعي و أبي صالح و الزهري و زيد بن أسلم و محمد بن كعب القرظي و السدي و قتادة و الضحاك .

---

**: ئەم ڕیوایەتانە لەلایەن ئەم زانایانەوە زیاتربەهێزی دەکەن (کە مانای وتنی وشەی شیرکە) والله اعلم .**

١٣١ - قتادة لەم ئایەتەدا : (فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٠] .

وتی : بۆمان باسکراوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : گەر بەندە غەمی کردنی چاکەیەکی بێت و نەیکات ئەوا چاکەکەی بۆ دەنوسرێت، وە گەر غەمی کردنی خراپەیەك بێ و پاشان بیکات ئەوا خراپەکەی بۆ دەنوسرێت .

(فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٠] .

**١٣٢** - أبي ذر رضي الله عنه وتی : الله تعالى لە قیامەت بە بەندە دەڵێت : ئەی بەندە، گەر بە چاکەیەك هاتیە لام، ئەوا من پاداشتی دە **[چاکەت]** دەدەمەوە، وە گەر بە خراپەیەک هاتیە لام، ئەوا من هەمان خراپەی پێ دەدەم، یان لێی خۆشدەبم .

**١٣٣** - پرسیار کرا لەدایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها دەربارەی منداڵی زینا .

ئەویش فەرمووی : **[منداڵەکە]** هیچ هەڵەیەکی لەسەر نییە لەو شتانەی دایك باوکی کردوویەتی، وە فەرمووی : (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٤].

**١٣٤** - مقاتل بن حيان دەربارەی ئەو ئایەتە : (وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ)، [سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٥]

دەڵێت : واتە : لە فەزڵ و دەوڵەمەندی .

---

**: و اتە کە الله تعالى هەندێکیان بەسەرهەندێکی تریلەیان بەرزترکردووە، ئەوا لە فەزیڵەتە وە یانیش لە دەوڵەمەندیە، والله اعلم .**

**١٣٥** - مقاتل بن حيان لەم ئایەتەدا : (**لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٥**] .

دەڵێت : دەوڵەمەند و هەژار، بەرێز و زەلیل، ئینسانی ئازاد و بەندە، هەموویان تاقی دەکرێنەوە .

**١٣٦** - سعيد بن جبير لەم ئایەتەدا : (**لَغَفُورٌ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٥**] .

وتی : واتە : لێخۆشبووە بۆ تاوانەکان .

**١٣٧** - محمد بن إسحاق لە هەمان ئایەت وتی : واتە : لە تاوانەکان خۆشدەبێت .

---

**: کاتێ کۆمەڵە کەسێ یەك قسە دەکەن مانای ئەوە نییە نەنوسرێ مادام جارێك نوسراوە، بەڵکو هەرچەندی وتراوە بینوسیت زیاتر تەفسیرەکەی بەهێز دەکات لەسەر ئەو مانایە، والله اعلم .**

**١٣٨** - سعيد بن جبير لەم ئایەتەدا : (**رَّحِيمُۢ**)، [**سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٦٥**] .

دەڵێت : واتە : میهرەبانە بۆ ئیمانداران .

**١٣٩** - محمد لە هەمان ئایەت دەڵێت : ڕەحم بە بەندەکانی دەکات لەوەی تێیاندایە .

آخر تفسير الأنعام

والحمد لله ربِّ العالمين

اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً

وصلّ الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين وسَلَّمَ تسليمًا

**https://t.me/Alaikumbisuuna**